# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كِتَابُ مَحاسَبَة النفسْ

تـأليف

أبي بكر عَبدالله بن محمّد بن عبيد بن سُفيان
القرشي المعرُوف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێڕانی :
مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردى

# مَوسُوعة ابن أبي الدُنيا

## كِتَابُ مَحاسَبَة النفسْ

تأليف

أبي بكر عبد الله بن محمّد بن عبيد بن سُفيان
القرشي المعرُوف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێڕانی :

مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردی

# كتاب محاسبة النفس

١ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا الهيثم بن خارجة، حدثنا بقية بن الوليد، عن أبي بكربن عبد الله بن أبي مريم، حدثني ضمرة بن حبيب، عن أبي يعلى شداد بن أوس الله قال : قال رسول الله ﷺ : (الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت، والعاجز من أتبع نفسه هواها وتمنى على الله عز وجل) .

١ - له شداد بن أوس ـەوە رضي الله عنه كە ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (تێگەشتوو و زیرەک ئەو کەسەیە کە لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی ئەکات و کار ئەکات بۆ دوای مردنی، وە مایەپووچ ئەو کەسەیە کە شوێن ئارەزووی نەفسی ئەکەوێت و هیوای بە الله عز وجل هەیە) .

---

: ئەو بەشەی کۆتای فەرموودەکە مەبەستی کەسێکە هەرتاوان و خراپەکاری ئەکات دواتریش ئەڵێ الله بە ڕەحمە الله لێخۆش بووە ئەمە جگە لە فریودانی ئیبلیس ونەفسی هیچی ترنیە چونکە لێخۆش بوون وڕەحمی الله نزیکە لە چاکەکارانەوە نەک خراپەکاران، والله أعلم .

٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا سفيان بن عيينة، عن جعفرابن برقان، عن ثابت بن الحجاج قال : قال عمر بن الخطاب له (حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا، وزنوا أنفسكم قبل أن توزنوا؛ فإنه أهون عليكم في الحساب غداً أن تحاسبوا أنفسكم اليوم، وتزينوا للعرض الأكبر يومئذ تعرضون لا تخفى منكم خافية) .

٢ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (لێپرسینەوە بکەن لە نەفستان پێش ئەوەی لێپرسینەوەیان لێ بکرێت، وە نەفسی خۆتان پێوانە بکەن پێش ئەوەی پێوانە بکرێت، لەبەر ئەوەی لێپرسینەوەی ئەمڕۆتان لە نەفستان لێپرسینەوەی بەیانیتان - واته قیامەت - ئاسان ئەکات، وە خۆتان پێوانە بکەن بۆ ڕۆژی پیشاندانی گەورە ئەو ڕۆژەی هیچ شتێک تیایدا شاراوە نیە) .

٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا هارون بن عبد الله، حدثنا معن بن عيسى، عن مالك بن أنس، عن إسحاق بن عبد الله، عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : (سمعت عمر بن الخطاب يوما وخرجت معه حتى دخل حائطاً فسمعته يقول وبيني وبينه جدار وهو في جوف الحائط : عمر بن الخطاب أمير المؤمنين، بخ، والله لتتقين الله ابن الخطاب أو ليعذبنك) .

٣ - أنس بن مالك رضي الله عنه ئەفەرمووێ : گوێم لە عمر بن الخطاب بوو ڕۆژێک کە لەگەڵیدا دەرچووم تا لای دیوارێک کە بەربەستێک هەبوو لە نێوانماندا ئەیفەرموو: عمر بن الخطاب، بخ، بە الله یان لە الله ئەترسیت ابن الخطاب یان سزات ئەدات) .

**: بخ وشەیەکە بۆ سەرسام بوون بەکاردێت لەلای عەرەب، ئەوە حاڵی کەسێکە کە رسول الله ﷺ مژدەی بەهەشتی پێداوە، هیچی ترناڵێم .**

٤ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا محمد بن يزيد العجلي، حدثنا أبو عامر العقدي، حدثنا قرة ابن خالد، عن الحسن** : ﴿وَلَا أُقسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَامَةِ﴾ **(القيامة : ٢)** .

قال : لا يلقى المؤمن إلا يعاتب نفسه؛ ماذا أردت بكلمتي؟ ماذا أردت بأكلتي؟ ماذا أردت بشربتي ؟ والعاجز يمضي قدما لا يعاتب نفسه .

٤ - الحسن دەربارەی ﴿وَلَا أُقسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَامَةِ﴾ **(القيامة : ٢)** .

ئەڵێ : ئیماندار ناگات بە نەفسی ئیللا لۆمەی ئەکات؛ مەبەستم لەم قسەیەم چی بوو؟ مەبەستم لەم خواردنەم چی بوو؟ مەبەستم لەم خواردنەوەم چی بوو؟ مایەپووچ یش ئەڕوات و لۆمەی نەفسی ناکات .

٦ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : وأخبرني صالح بن مالك، أن أبا عبيدة الناجي حدثهم قال : سمعت الحسن يقول : (إن العبد لا يزال بخير ما كان له واعظ من نفسه وكانت المحاسبة من همته) .

٦ - الحسن ئەڵێ : (بەندە بەردەوام لە خێردایە مادام لە نەفسیدا ئامۆژگاری کارێک هەبێت و لێپرسینەوە لە خەیاڵ و مەبەستەکانی بکات) .

٧ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا سريج بن يونس، حدثنا سليمان بن حيان، عن جعفر بن برقان عن ميمون بن مهران قال : (لا يكون الرجل تقياً حتى يكون لنفسه أشد محاسبة من الشريك لشريكه) .

٧ - میمون بن مهران ئەڵێ : (پیاو نابێتە موتتەقی تا لێپرسینەوەی لە نەفسی توندتر نەبێت لە لێپرسینەوەی شەریکێک لە شەریکەکەی) .

---

: ئەگەر دوو کەس شەریکی یەک بن لە کاروکاسپیەکدا ئەوا لێپرسینەوەیان لە یەک زۆر توندە و حسابی دینار بە دینار ئەکەن جا مەبەستی ئیمام رحمه الله ئەوەیە ئەبێت لەوە توندتر لێپرسینەوە لە نەفس بکرێت و حسابی بچوکترین شتی لەگەڵدا بکرێت .

٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا أبو حفص الصفار أحمد بن حميد، حدثنا جعفر سليمان** : سمعت مالك بن دينار يقول : (رحم الله عبداً قال لنفسه النفيسة : ألست صاحبة كذا؟ ألست صاحبة كذا؟ ثم ذمها ثم خطمها، ثم ألزمها كتاب الله؛ فكان لها قائدا) .

٨ - مالك بن دينار ئەڵێ : (الله ڕەحم بە بەندەیەک بکات کە بە نەفسی خۆبەلزانی ئەڵێ : ئایا خاوەنی ئەمە نیت؟ ئایا خاوەنی ئەوە نیت؟ دواتر سەرزەنشتی ئەکات دواتر لوتی ئەشکێنێت، دواتر پەیوەستی ئەکات بە کیتابی الله ـەوە، بۆی ئەبێت بە سەرکردە) .

٩ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا أبو موسى العبدي، عن أبي المليح، عن** ميمون بن مهران قال : (التقي أشد محاسبة لنفسه من سلطان عاص، ومن شريك شحيح) .

٩ - میمون بن مهران ئەڵێ : (کەسی موتتەقی لێپرسینەوەی لە نەفسی توندترە لە سوڵتانێکی توندوتیژ، وە لە شەریکێکی بەخیل و ڕەزیل) .

١٠ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : **حدثنا إسحاق بن إبراهيم، أنه سمع سفيان بن عيينة يقول** : قال إبراهيم التيمي : (مثلت نفسي في الجنة آكل ثمارها، وأشرب من أنهارها، وأعانق أبكارها، ثم مثلت نفسي في النار آكل من زقومها، وأشرب من صديدها، وأعالج سلاسلها وأغلالها؛ فقلت لنفسي : أي نفسي، أي شيء تريدين؟

قالت : أريد أن أرد إلى الدنيا فأعمل صالحا .

قلت : فأنت في الأمنية فاعملي) .

١٠ - إبراهيم التيمي وتى : (وێنای نەفسی خۆمم کرد کە لە بەهەشتدا لە بەروبومەکانی ئەخۆم، وە لە ڕووبارەکانی ئەخۆمەوە، وە ئەچمە لای کچەکانی ناوی، دواتر وێنای نەفسی خۆمم کرد لە دۆزەخدا لە زەقوم ئەخۆم، وە لە ئاوی کوڵاوی ئەخۆمەوە، وە زنجیر و کۆتم پێوەیە، بە نەفسی خۆمم وت : ئەی نەفسم کام شتەیانت ئەوێت؟

وتی : ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ دنیا کاری باش ئەنجام بدەم .

وتم : تۆ لە ئەمینیدایت کار بکە .

---

: لە ئەمینیدایت و اتا هێشتا کاتت ماوە و نەمردوویت و کاروکردەوەت نەپچڕاوە بۆیە کاروکردەوەی باش بکە، والله أعلم .

**١٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أبو خيثمة، حدثنا عبد الرحمن بن مهدي، عن سفيان عن أبي الأغر، عن وهب بن منبه قال : (مكتوب في حكمة آل داود** حق على العاقل أن لا يغفل عن أربع ساعات : ساعة يناجي فيها ربه، وساعة يحاسب فيها نفسه وساعة يخلو فيها مع إخوانه الذين يخبرونه بعيوبه ويصدقونه عن نفسه، وساعة يخلو فيها بين نفسه وبين لذاتها فيما يحل ويحمد؛ فإن في هذه الساعة عونا على تلك الساعات وإجماما للقلوب .

وحق على العاقل أن لا يرى ظاعناً إلا في ثلاث : زاد الميعاد، أو مرمة لمعاش أو لذة في غير محرم .

وحق على العاقل أن يكون عارفاً بزمانه حافظاً للسانه، مقبلاً على شأنه) .

١٢ - وهب بن منبه ئەڵێ : (لە حیکمەتی آل داود نوسراوە : پێویستە لەسەر کەسی عاقڵ بێ ئاگا نەبێت لە چوار کات : کاتێک کە موناجاتی تێدا بکات لەگەڵ پەروەردگاریدا، وە کاتێک کە تیایدا لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی بکات، وە کاتێک کە تیایدا دابنیشێت لەگەڵ براکانیدا هەواڵی پێبدەن بە عەیبەکانی و ئەویش لە نەفسی خۆیدا بەڕاستیان بخاتەوە، وە کاتێک کە تیایا تەنها ببنەوە خۆی و ئەو خۆشیانەی کە حەلاڵن و سوپاسی لەسەر بکات . . .) .

١٣ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا خالد بن خداش عن حماد بن زيد عن زريق بن رديح عن سلمة بن منصور عن مولى لهم كان يصحب الأحنف بن قيس قال : (كنت أصحبه فكان عامة صلاته الدعاء، وكان يجيء المصباح فيضع أصبعه فيه، ثم يقول : حس .

ثم يقول : يا حنيف، ما حملك على ما صنعت يوم كذا؟ ما حملك على ما صنعت يوم كذا؟) .

١٣ - مەولای الأحنف بن قيس ئەڵێ : هاوەڵیم کرد زۆربەی نوێژەکانی دوعا کردن بوو، وە چراکەی ئەهێنا و پەنجەی لەسەر دائەنا دواتر ئەیوت : هەست بکە .

دواتر ئەیوت : ئەی حنیف چ شتێک وای لێ کردیت ئەو ڕۆژە ئەو کارە بکەیت؟ چ شتێک وای لێ کردیت ئەو ڕۆژە ئەو کارە بکەیت؟

---

: بەو شێوەیە لە نەفسی خۆی ئەپرسێتەوە و پێی ئەڵێت ئارامیت کوا لەسەر ئەم ئاگرەی ئێرە؟ کە ئارامیت نیە ئەی بۆچی تاوان ئەکەیت و خۆت شایستەی سزای دۆزەخ ئەکەیت کە گەورەترە لەم ئاگرەی ئێرە؟

**٢٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الحسن بن حماد الكوفي الضبي، حدثنا إبراهيم بن عيينة الكوفي، سمعت أبا الصباح، يذكرعن أبي نصيرة، عن مولى لأبي بكر قال** : قال أبو بكر الصديق : (من مقت نفسه في ذات الله آمنه الله من مقته).

**٢٢** - أبو بكر الصديق رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (هەرکەس لە نەفسی خۆی تورە ببێت لە پێناوی زاتی الله، الله ش ئەمینی ئەکات لە تورەیی خۆی) .

**٢٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني سريج بن يونس، حدثنا محمد بن عبد الرحمن الطفاوي عن أيوب، عن أبي قلابة، عن أبي الدرداء قال** : (لا يفقه الرجل كل الفقه حتى يمقت الناس في جنب الله، ثم يرجع إلى نفسه فيكون لها أشد مقتاً) .

**٢٣** - أبي الدرداء ئەفەرمووێ : (پیاو ناگات بە فیقهـ و تێگەشتنێکی تەواو تا ئەو کاتەی تورە ئەبێت لە خەڵکی لە پێناوی الله، دواتر ئەگەڕێتەوە بۆ نەفسی خۆی زیاتر و توندتر لێی تورە ئەبێت) .

**٢٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أبو سلمة يحيى بن خلف الجوينباري، حدثنا معتمربن سليمان، عن أبيه قال :** (قال بكر يعني ابن عبد الله المزني أو قال رجل : لما نظرت إلى أهل عرفات ظننت أنه قد غفر لهم لولا أني كنت فيهم) .

٢٦ - بكر بن عبدالله المزني ئەڵێ : (کاتێک سەیری ئەهلی عەرەفات م کرد وا گومانم برد کە ئەو لێیان خۆش بووە ئەگەر بێتو منیان لەناودا نەبوویایە) .

**٢٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا داود بن عمرو الضبي، عن محمد بن الحسن الأسدي عن جعفر بن سليمان قال :** (قال مالك بن دينار أذكر الصالحين، فأف لي وتف) .

٢٧ - مالك بن دينار ئەڵێ : پیاوچاکان ئەکەمەوە، ئۆف لە من و تف لە من) .

**٢٨ - قال إبن أبي الدّنيا : وحدثني أحمد بن عاصم العباداني، عن سعيد عامر، عن وهيب بن خالد قال** : قال أيوب السختياني : (إذا ذكر الصالحون كنت منهم بمعزل) .

٢٨ - أيوب السختياني ئەڵێ : (کاتێک باسی پیاوچاکان کرا ئەوە من لەوان نیم) .

**٢٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني الحسن بن الصباح، حدثنا محمد بن يزيد بن خنيس** سمعت سفيان الثوري يقول : (جلست ذات يوم أحدث ومعنا سعيد بن السائب الطائفي، فجعل سعيد يبكي حتى رحمته فقلت يا سعيد، ما يبكيك وأنت تسمعني أذكر أهل الخير وفعالهم؟

قال : يا سفيان وما يمنعني من البكاء وإذا ذكر مناقب أهل الخير كنت منهم بمعزل؟

قال : يقول سفيان : حق له أن يبكي) .

٢٩ - سفيان الثوري ئەڵێ : ڕۆژێکیان دانیشتبووم و حەدیثم ئەگێڕایەوە سعید بن السائب الطائفي مان لەگەڵدا بوو سعید گریا تا ڕەحمم بۆی جوڵا پێم وت: ئەی سعید چی ئەتگریەنێت لەکاتێکدا تۆ گوێت لە منە کە باسی ئەهلی خێر و کردارەکانیان ئەکەم؟

وتی: ئەی سفیان چی ڕێگریم لێئەکات لە گریان لەکاتێکدا باسی تایبەتمەندیە باشەکانی ئەهلی خێر ئەکەیت و منیش لەوان نیم؟

سفیان وتی : حەقی خۆیەتی کە بگریەت) .

**٣١ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني أبو إبراهيم إسماعيل بن إبراهيم، حدثنا عامر بن يساف، عن مالك بن دينار قال : إن قوما من بني إسرائيل كانوا في مسجد لهم في يوم عيد لهم، فجاء شاب حتى قام على باب المسجد فقال : أنا صاحب كذا ليس مثلي يدخل معكم، أنا صاحب كذا يزري على نفسه .**

**فأوحى الله عز وجل إلى نبيهم أن فلاناً صديق) .**

٣١ - مالك بن دينار ئەڵێ : (کەسانێک لە بەنی ئیسرائیل لە مزگەوتێکیاندا لە جەژنێکیاندا بوون، گەنجێک هات وەستا لەلای دەرگای مزگەوتەکە و وتی: من خاوەنی ئەوەم کەسی وەک من لەگەڵ نایەتە ژوورەوە بۆ لای ئێوە، من خاوەنی ئەوەم، نەفسی خۆی عەیبدار کرد .

الله عز وجل وەحی کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان کە فلان ڕاستگۆیە).

**٣٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن عمر بن علي المقدمي، حدثنا** سعيد بن عامر، بلغني عن يونس بن عبيد قال: (إني لأعد مائة خصلة من خصال الخير ما أعلم أن في نفسي واحدة منها) .

**٣٤ -** يونس بن عبيد ئەڵێ : (من **١٠٠** تايبەتمەندى لە تايبەتمەنديە باشـەكان ئەژمێرم وا نازانم كە لە مندا يەک دانەش لەوانە بوونى هەبێت).

---

**: منيش دەيان تايبەتمەندى خراپ ئەژمێرم كە لە مندا بوونى هەيە و لە كەسى تردا بوونى نيە .**

**٣٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا إبراهيم بن عبد الله، عن إسماعيل بن** علية قال : بلغني عن محمد بن واسع قال : (لو كان للذنوب ريح ما قدر أحد أن يجلس إلي) .

**٣٧ -** إسماعيل بن علية ئەڵێ : پێم گەشتووە كە محمد بن واسع وتوويەتى : (ئەگەر بێتو تاوانەكان بۆنيان هەبوايە ئەوا كەس نەيئەتوانى دابنيشێت لەلام) .

**٤٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين، عن يحيى بن عبد الحميد، حدثني ابن سماك قال : قال داوود الطائي : (تركنا الذنوب وإنا لنستحي من كثير من مجالسة الناس) .**

**٤٣** - داود الطائي ئەڵێ : (وازمان لە تاوان هێنا وە ئێمە شەرم ئەکەین لە زۆری دانیشتمان لەگەڵ خەڵکیدا) .

---

**: مەبەستی ئەوەیە کە خەڵکی بە باش ئەمانبینن و ئێمەش تاوان ئەکەین بۆیە شەرم ئەکەین لەوەی دابنیشین لەگەڵیان تا وازلە تاوان نەهێنین، والله أعلم .**

**٤٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا المثنى بن معاذ العنبري، حدثنا أبي، عن** شعبة، عن منصور، عن إبراهيم : (أن رجلا من العباد كلم امرأة فلم يزل حتى وضع يده على فخذها فوضع يده في النار حتى نشت) .

**٤٨** - لە إبراهیم ەوە کە : (پیاوێک لە خواپەرستەکان قسەی لەگەڵ ئافرەتێکدا کرد بەردەوام تا وای لێهات دەستی لەسەر ڕانی دانا، پاشان دەستی لەسەر ئاگر دانا تا برژا) .

**٥٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن عبد الله بن محمد، عن عبد** الجبار بن النضر السلمي قال : مر حيان بن أبي سنان بغرفة فقال : متى بنيت هذه؟

ثم أقبل على نفسه فقال : (تسألين عما لا يعنيك لأعاقبنك بصوم سنة) .

فصامها .

**٥٣ -** عبدالجبار بن النضر السلمي ئەڵێ : حيان بن أبي سنان تێپەڕی بەلای ژوورێکدا وتی : (کەی ئەمە بنیات نراوە؟)

دواتر ڕووی کردە نەفسی خۆی وتی : (پرسیار ئەکەیت دەربارەی شتێک کە نیازت پێی نیە؟ سزات ئەدەم بە ڕۆژووی یەک ساڵ) .

جا بەڕۆژوو بوو.

**٥٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين، حدثنا يونس بن يحي أبو نباتة الأموي، عن منكدربن محمد، عن أبيه، أن :** (تميما الداري نام ليلة لم يقم يتهجد فيها حتى أصبح، فقام سنة لم يتم فيها عقوبة للذي صنع) .

٥٥ - له منكدر بن محمد له باوكيەوه كه : (تميم الداري رضي الله عنه شەوێكيان خەوت و هەڵنەستا شەونوێژى تيا بكات تا بەيانى، ساڵێک تيايا شەونوێژى كرد و نەخەوت وەک سزايەک بۆ ئەوەى كردى) .

٥٨ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني سلمة بن شبيب، حدثنا سهل بن عاصم، عن أبي يزيد الرقي، قال حذيفة بن قتادة قيل لرجل : كيف تصنع في شهوتك؟

قال : ما في الأرض نفس أبغض إلى منها فكيف أعطيها شهوتها ؟

٥٨ - حذيفة بن قتادة به پياوێكى وت : چۆن ئەجوڵێيتەوە لەگەڵ حەزەكانت؟

وتى : هيچ نەفسێک نييه لەو زياتر ڕقم لێى بێت، چجاى ئەوەى ئارەزوو و شەهوەتەكانى پێ ببەخشم؟!) .

٥٩ - قال إبن أبي الدُّنيا : سمعت أبا جعفر الكندي في جنازة بشر بن الحارث يقول : دخل ابن السماك على داود الطائي حين مات وهو في بيت على التراب فقال داود : (سجنت نفسك قبل أن تسجن، وعذبت نفسك قبل أن تعذب، فاليوم ترى من كنت له تعمل) .

**٥٩** - أبا جعفر الكندي ئەڵێ : ابن السماك چووە لای داود الطائي لەو کاتەی مرد و ئەویش لەسەر خۆڵ بوو لە ماڵەکەی .

داود وتی : (نەفست سجن کرد پێش ئەوەی سجن بکرێت، وە سزای نەفستدا پێش ئەوەی سزا بدرێت، ئەمڕۆ ئەبینیت داخۆ کارت بۆ کێ ئەکردا!) .

**٦٠** - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن الحسين، حدثنا سليمان بن حرب، حدثنا مهدي بن ميمون، عن عبد الحميد صاحب الزنادي، عن وهب بن منبه** : أن رجلاً تعبد زماناً ثم بدت له إلى الله حاجة فصام سبعين سبتاً، يأكل كل سبت إحدى عشرة تمرة، ثم سأل الله حاجته فلم يعطها فرجع إلى نفسه فقال : منك أتيت، لو كان فيك خير أعطيت حاجتك .

فنزل إليه عند ذلك ملك فقال : يا ابن آدم ساعتك هذه خير من عبادتك التي مضت وقد قضى الله حاجتك .

**٦٠** - لە وهب بن منبه ەوە کە : (پیاوێک زەمانێک خواپەرستی ئەکرد پێویستیەکی کەوتە الله **٧٠** شەممە بەڕۆژوو بوو، هەموو شەممەیەک **١١** خورمای ئەخوارد، دواتر داوای پێویستیەکەی لە الله کرد ئەویش پێی نەبەخشی

جا گەڕایەوە بۆ لای نەفسی خۆی و وتی : لە تۆوەوەیە، ئەگەر بێتو خێرت تیا بووایە ئەوا پێتی ئەبەخشی .

لەو کاتەدا فریشتەیەک دابەزی بۆ لای فەرمووی : ئەی نەوەی ئادەم ئەم ساتەت باشتر بوو لەو عیبادەتەت کە تێپەڕی بەڕاستی الله پێویستیەکەتی بۆ جێبەجێ کردیت) .

٦١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا محمد بن سليمان الأسدي، حدثنا أبو الأحوص، عن سعيد بن مسروق، عن أبي حازم، عن أبي هريرة الله قال** : قال رسول الله ﷺ : (إن الشديد ليس الذي يغلب الناس، ولكن الشديد من غلب نفسه) .

٦١ - لە أبي هريرة ـەوە رضي الله عنه کە ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (بەهێز ئەو کەسە نیە زاڵ ئەبێت بەسەر خەڵکیدا و ئەیانبەزێنێت، بەڵکو بەهێز ئەو کەسەیە کە زاڵ ئەبێت بەسەر نەفسی خۆیدا و ئەیبەزێنێت) .

٦٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني يعقوب بن إسماعيل، أخبرنا حبان بن موسى، أخبرنا عبد الله، أخبرنا حيوة بن شريح، أخبرني أبو هانئ الخولاني، أنه سمع عمرو بن مالك الجهني يقول: أنه سمع فضالة بن عبيد يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (المجاهد من جاهد نفسه في الله عز وجل) .

٦٤ - فضالة بن عبيد ئەفەرمووێ : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ ئەیفەرموو: (موجاهید ئەو کەسەیە کە جیهادی نەفسی خۆی ئەکات لەپێناوی الله عز وجل) .

٦٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أحمد بن عمران، عن عبد السلام بن حرب، سمعت مالك بن دينار يقول لنفسه : (إني والله ما أريد بك إلا الخير) مرتين.

٦٥ - لە عبدالسلام بن حرب ـەوە کە ئەڵێ : گوێم لێبوو مالك بن دينار دووجار بە نەفسی خۆی ئەوت : (والله من هیچ نیازم پێت نیە جگە لە خێر).

---

: و اتا من تەنها خێرم لە تۆ ئەوێت و غەیری خێرکە شەڕوتاو انە نامەوێت ئەمەش ئاگادارکردنەوەی نەفسی و ترساندنیەتی، والله أعلم .

**٦٦ - قال إبن أبي الدّنيا** : أخبرني سويد بن سعيد عن مسلم بن عبيد السلمي أبي فراس عن إسماعيل بن أمية قال : (كان الأسود بن يزيد مجتهداً في العبادة ويصوم حتى يخضر جسده ويصفر .

فكان علقمة يقول له : كم تعذب هذا الجسد؟

فكان الأسود يقول : إن الأمر جد فجدوا .

وقال غيره : قال الأسود : كرامة هذا الجسد أريد).

**٦٦** - إسماعيل بن أمية ئەڵێ : (الأسود بن يزيد تێئەكۆشا لە عیبادەتدا و بەڕۆژوو ئەبوو تا جەستەی سەوز و زەرد هەڵئەگەڕا .

علقمة پێی وت : چەندێک سزای ئەم جەستەت ئەدەیت؟

الأسود وتی: كارەكە جددیە جددی بن .

وە وتی: ڕێز و كەڕامەتی ئەم جەستەیەم ئەوێت) .

**٦٧ - قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني الحسين بن عبد الرحمن، حدثني أبو عثمان المؤدب قال : قال محمد بن الحنفية : (من كرمت عليه نفسه لم يكن للدنيا عنده قدر) .

٦٧ - محمد بن الحنفية ئەڵێ : (هەركەس ڕێز لە نەفسی خۆی بگرێت ئەوا دونيا لەلای هيچ قەدرێكی نابێت) .

---

: ڕێزگرتن لە نەفس ئەوە نيە داوای هەرچيەكی كرد بۆی جێبەجێ بكەيت، بەڵكو بريتيە لە ئەنجامدانی عيبادەتەكان بۆ الله عزوجل وڕێگری لێكردنی لە تاوان وخراپە، چونكە تاوان نەفس سوک وزەليل ئەكات، عيبادەت وگوێڕايەڵيش نەفس بەعيززەت ئەكات، وە لە قيامەتدا ئەگەر چوويتە بەهەشتەوە ئەوە نەفست ڕێزدار و سەربەرز ئەبێت، وە ئەگەر بچيتە جەهەننەمەوە والعياذ بالله نەفست سووک و بێڕێز ئەبێت، الله عزوجل بمانپارێزێت بە ڕەحمەتی خۆی .

٦٩ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثني محمد بن عبد المجيد التميمي، أنه سمع ابن عيينة يقول : قال محمد بن الحنفية : (إن الله جعل الجنة بمثابة لأنفسكم فلا تبيعوها بغيرها) .

٦٩ - محمد بن الحنفية ئەڵێ : (الله بەهەشتی داناوە بە لەبری نەفستان، مەيفرۆشن بە جگە لەوە) .

٧٧ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثني رجل من قريش ذكر أنه من ولد طلحة بن عبيد الله قال : كان توبة بن الصمة بالرقة وكان محاسباً لنفسه

فحسب فإذا هو ابن ستين سنة فحسب أيامها فإذا هي أحد وعشرون ألف يوم وخمسمائة يوم، فصرخ وقال : يا ويلتي ألق المليك بأحد وعشرين ألف ذنب، كيف وفي كل يوم عشرة آلاف ذنب ثم خر مغشيا عليه فإذا هو ميت.

فسمعوا قائلا يقول: يا لك ركضة إلى الفردوس الأعلى.

٧٧ - پیاوێک لە قورەیش بۆی گێڕامەوە کە کوڕێکی طلحة بن عبیدالله وتوویەتی : (توبة بن الصمة لە ڕەققە بووە و لە نەفسی خۆی پرسیوەتەوە لەکاتێکدا شەست ساڵ بووە، ڕۆژەکانی ژماردووە کاتێک ئەو بیست و یەک هەزار و پێنسەد ڕۆژ بووە، جا ترساوە و وتوویەتی : وەیل بۆ من ئەگەمەوە بە پادشا بە بیست و یەک هەزار تاوانەوە، ئەی چۆن ئەبێت لە هەر ڕۆژێکدا دە هەزار تاوانم کردبێت، دواتر بوورایەوە و مرد، گوێمان لێبوو کەسێک وتی: ڕاکردنێک بۆت بۆ فیردەوسی بەرز و بڵند) .

٧٩ - **قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا إسحاق بن إبراهيم، سمعت حماد بن زيد،** يذكر عن الحسن قال : (المؤمن في الدنيا كالغريب لا ينافس في عزها ولا يجزع من ذلها، للناس حال وله حال، الناس منه في راحة ونفسه منه في شغل) .

٧٩ - الحسن ئەڵێ : (ئیماندار لە دونیا وەک نامۆ وایە، کێبڕکێ ناکات لە شکۆداریەکەیدا، وە خەفەت بۆ ناخۆشیەکەی ناخوات، خەڵکی لە بار و دۆخێکدا و ئەمیش لە بارودۆخێکدایە، خەڵکی لێی لە ئیسراحەتدان وە نەفسی لێی لە سەرقاڵیدایە) .

---

**: مەبەستی ئەوەیە ئیماندار بەشێوەیەکی وا سەرقاڵی نەفسی خۆیەتی کە نایپەرژێتە سەرخەڵکی ئیترخەڵکیش لە دەست و دەمی ئیسراحەتن، الله أعلم .**

٨٠ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا الحسن بن الصباح، حدثنا الحسين بن محمد، عن سهل ابن أسلم العدوي، كان بكر بن عبد الله المزني إذا رأى شيخا** قال : هذا خير مني هذا عبد الله قبلي، وإذا رأى شاباً قال: هذا خير مني ارتكبت من الذنوب أكثر مما ارتكب) .

٨٠ - سهل بن أسلم العدوي ئەڵێ: بکر بن عبدالله المزني کاتێک پیاوێکی بە تەمەنی ببینیایە ئەیوت : ئەمە لە من باشترە، ئەمە پێش من بەندایەتی الله ی کردووە، وە کاتێک گەنجێکی ببینیایە ئەیوت : ئەمە لە من باشترە، من تاوانم زیاتر کردووە لەچاو ئەوەی ئەو کردوویەتی) .

**٨٢ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني محمد بن الحسين، حدثني محمد بن مالك** بن ضيغم حدثني مولانا أبو أيوب قال : قال لي أبو مالك يوماً : (يا أبا أيوب احذر نفسك على نفسك، فإني رأيت هموم المؤمنين في الدنيا لا تنقضي، وايم الله لئن لم تأت الآخرة والمؤمن بالسرور لقد اجتمع عليه الأمران : هم الدنيا وشقاء الآخرة .

قلت : بأبي أنت وأمي، وكيف لا تأتيه الآخرة بالسرور وهو ينصب الله في دار الدنيا ويدأب؟

قال: يا أبا أيوب، فكيف بالقبول؟ وكيف بالسلامة؟

ثم قال: كم رجل يرى أنه قد أصلح شأنه، قد أصلح قربانه، قد أصلح همته، قد أصلح عمله يجمع ذلك يوم القيامة ثم يضرب به وجهه ! ) .

٨٢ - أبو أيوب ئەڵێ : ڕۆژێک أبو مالك پێی وتم : ئەی أبا أيوب ئاگاداری نەفست بە لەسەر خۆت، من بينيومە خەمی ئيمانداران لە دونيا تەواو نابێت، سوێند بە الله ئەگەر بێتو ئيماندار نەگاتە قيامەت بە دڵخۆشی دوو شتی لەسەر کۆئەبنەوە کە : خەمی دونيا و نارەحەتی قيامەتە .

وتم: بە دايک و باوکەوە بە قوربانت بم، چۆن ناگات بە قيامەت بە دڵخۆشی لەکاتێکدا ئەو خۆی يەکلايی کردووەتەوە بۆ الله لە دونيا؟

وتی: ئەی أبا أيوب ئەی چی دەربارەی قبوڵ بوون؟ ئەی چی دەربارەی سەلامەتی؟ چەند پیاو هەبوون کە وا بینیان کە حاڵی خۆیان چاک کردووە، وە نزیکی خۆیان چاک کردووە، وە خەمی خۆیان چاک کردووە، وە کردەوەی خۆیان چاک کردووە، لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی کۆئەکرێتەوە دواتر ئەدرێتەوە بە ناوچاویدا) .

٨٣ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن بشير، حدثنا عبد المجيد بن عبد العزيز،** عن أبيه قال : (أدركتهم يجتهدون في الأعمال فإذا بلغوها ألقي عليهم الهم والحزن لا يدرون قبلت منهم أو ردت عليهم؟) .

٨٣ - عبدالمجيد بن عبدالعزيز لە باوکیەوە ئەڵێ : (گەشتووم بە کەسانێک کە تێئەکۆشان لە کردەوەکاندا، کاتێک کارەکانیان تەواو ئەکرد خەم و پەژارە ئەکەوتە سەریان لەبەر ئەوەی نازانن لێیان قبوڵ کراوە یان دراوەتەوە بە ناوچاویاندا؟) .

٨٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن عباد المكي أبو عبد الله، حدثنا** سفيان، عن مالك بن مغول قال : (كان رجل يبكي فتقول له أهله لو قتلت قتيلاً ثم جئت لأهله تبكي لعفوا عنك .

فيقول : إنما قتلت نفسي) .

٨٨ - مالك بن مغول ئەڵێ : (پیاوێک ئەگریا خێزانەکەی پێی ئەوت : ئەگەر کەسێکیشت کوشتووە دواتر بچیتە لای خانەوادەکەی بگری ئەوا لێت ئەبورن .

جا ئەیوت : من نەفسی خۆمم کوشتووە) .

٩١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن الحسين، حدثنا زيد بن الحباب،** حدثنا زائدة بن قدامة قال : كان منصور بن المعتمر إذا رأيته قلت : رجل قد أصيب بمصيبة ولقد قالت له أمه: ما هذا الذي تصنع بنفسك؟ تبكي الليل عامته لا تكاد أن تسكت لعلك يا بني أصبت نفساً، قتلت قتيلاً .

فيقول : يا أماه، أنا أعلم بما صنعت نفسي) .

٩١ - زائدة بن قدامة ئەڵێ : (ئەگەر منصور بن المعتمر ت ببینیایە ئەتوت ئەمە کێشەی و بەڵایەکی تووش بووە، وە دایکی پێی وت : ئەمە چیە کە ئەیکەیت بە نەفسی خۆت؟ هەموو شەوەکە ئەگریت و بێدەنگ نابیت لەوە ئەچێت کەسێکت کوشتبێت کورم .

ئەیوت : ئەی دایکە، خۆم ئەزانم چیم بە نەفسی خۆم کردووە) .

**٩٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين، حدثني يحيى بن راشد،** حدثني محمد ابن الحسن بن عبد ربه القيسي وكان ذا قرابة لرباح قال : (كنت أدخل عليه المسجد وهو يبكي، وأدخل عليه البيت وهو يبكي، وآتيه في الجبال وهو يبكي، فقلت له يوما أنت دهرك في مأثم .

فبكى ثم قال : يحق لأهل المصائب والذنوب أن يكونوا هكذا) .

**٩٣ -** محمد ابن الحسن بن عبد ربه القيسي كه كەسێكى نزيكى رياح ه ئەڵێ : (ئەچوومە لای بۆ مزگەوت ئەگريا، ئەچوومە لای بۆ ماڵەوە ئەگريا، پێی ئەگەشتم لە شاخدا ئەو ئەگريا، رۆژێک پێم وت: تۆ هەميشە لە تاواندايت .

گريا و وتی: حەقە كەسانی تاوانبار ئاوا بن) .

**٩٦ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني سلمة بن شبيب، عن إبراهيم بن الأشعث، سمع فضيل ابن عياض يقول في قوله عز وجل : ﴿ **وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ** ﴾ (النساء : ٢٩) .

قال : (لا تغفلوا عن أنفسكم .

ثم قال : من غفل عن نفسه فقد قتلها) .

**٩٦** - الفضيل بن عياض دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ **وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ** ﴾ **(النساء : ٢٩)**

وتی : (بێ ئاگا مەبن لە نەفستان) .

دواتر وتی : (هەرکەس بێ ئاگا بێت لە نەفسی خۆی ئەوە کوشتوویەتی) .

**٩٧** - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن عبد المجيد التميمي، عن** سفيان بن عيينة قال : كان الرجل من السلف يلقى الأخ من إخوانه فيقول : يا هذا اتق الله وإن استطعت أن لا تسيء إلى من تحب فافعل .

فقال له رجل يوما : وهل يسيء الإنسان إلى من يحب؟

قال : نعم نفسك أعز الأنفس عليك، فإذا عصيت الله فقد أسأت إلى نفسك .

**٩٧** - سفيان بن عيينة ئەڵێ : (پیاوێک لە سەلەف ئامۆژگاری برایەک لە براکانی ئەکرد و پێی ئەوت : لە الله بترسە ئەگەر توانات هەیە خراپە نەکەیت بەرامبەر ئەو کەسەی کە خۆشت ئەوێت ئەوە بیکە .

ڕۆژێکیان پیاوێک پێی وت : ئەکرێت ئینسان کەسێکی خۆش بوێت وە خراپەی بەرامبەر بکات؟

وتی : بەڵێ، نەفست بەعیزەتترین نەفسە لەلات، کاتێک سەرپێچی اللە ت کرد ئەوا خراپەت بەرامبەری کردووە) .

**١٠٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني أبو حفص الصيرفي، حدثنا عبد الرحمن بن مهدي سمعت محمد بن النضر الحارثي، فحاك في نفسي منه شيء فحدثني مفضل بن يونس**، عن محمد بن الزفر قال : (ذكر رجل عند الربيع بن خيثم فقال : ما أنا عن نفسي براض فأنفرغ منها إلى ذم غيرها، إن العباد خافوا الله على ذنوب غيرهم وأمنوه على ذنوب أنفسهم) .

**١٠٤** - محمد بن الزفر ئەڵێ : (باسی پیاوێک کرا لای الربیع بن خیثم وتی: من لە نەفسی خۆم ڕازی نیم تا لێیبمەوە بۆ زەمی غەیری نەفسی خۆم، بەندەگەلێک لە اللە ئەترسن لەسەر تاوانی غەیری خۆیان وە ئەمینن لێی لەسەر تاوانی خۆیان) .

**١٠٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين، حدثني رستم بن أسامة، حدثني إبراهيم بن رستم الخياط جليس لأبي بكربن عياش، عن أبي بكر بن**

عياش قال : (قال لي رجل مرة وأنا شاب : خلص رقبتك ما استطعت في الدنيا من رق الآخرة فإن أسير الآخرة غير مفكوك أبدا .

قال أبو بكر: فما نسيتها بعد) .

**١٠٩** - أبي بكر بن عياش ئەڵێ : (جارێكیان پیاوێک پێی وتم من ئەوكات گەنج بووم : گەردنت ئازاد بكە لە دونیا ئەوەندەی ئەتوانیت لە كۆیلەیەتی قیامەت، چونكە بەندكراوی قیامەت هەرگیز ئازاد ناكرێت .

أبو بكر ئەڵێ : ئەوەم بیرم نەچووەوە هەرگیز) .

**١١٤ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني سلمة بن شبيب، عن سهيل بن عاصم، عن أبي ربيعة قال: قال عمر بن عبد العزيز : (أفضل الأعمال ما أكرهت عليه النفوس) .

**١١٤** - عمر بن عبدالعزیز ئەڵێ : (باشترین كردارەكان ئەوەیە كە بە زۆر بە نەفسەكان ئەكرێت) .

---

: بۆ نمونە ئەنجامدانی نوێژ لە كاتی خۆیدا، گرتنەوەی چاو و داوێن لە حەرامەكان، وە هەرشتێكی تر كە نەفس رِقی لێیەتی و بە زۆرپێی ئەكرێت .

١١٦ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا سلمة بن شبيب، حدثنا الحسن بن محمد الحراني سمعت زهيرا يقول :** سمعت أبا شيبة الزبيدي يقول : (خفت نفسي ورجوت ربي، وأنا أحب أن أفارق ما أخاف إلى ما أرجو) .

١١٦ - أبا شيبة الزبيدي ئەڵێ : (لە نەفسم ئەترسم و ئومێدم بە پەروەردگارم هەیە، وە من پێم خۆشە لەوەی ئەترسم جیاببمەوە بەرەو لای ئەوەی کە ئومێدم پێی هەیە) .

١١٧ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الحسين بن عبد الرحمن، عن منصور بن صغير قال :** قال يزيد الرقاشي : (ابن آدم إنك رقيق على الناس غليظ بعضك على بعض، لو نعي إليك بعض أهلك بكيت، وأنت كل يوم تنعى إليك نفسك لا تبكيها) .

١١٧ - يزيد الرقاشي ئەڵێ : (نەوەی ئادەم تۆ نەرمیت لەسەر خەڵک وە هەندێکت توندە لەسەر هەندێکی تر، ئەگەر بێتو هەواڵی مردنی یەکێک لە کەسوکارت پێ بگات ئەگریت، وە تۆ هەموو ڕۆژێک هەواڵی مردنی نەفسی خۆتت بۆ دێت کەچی ناگریت) .

١١٨ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن سعيد بن صخر الدارمي، عن** أبيه قال : (قيل لرجل : صف لنا الأحنف بن قيس.

قال : ما رأيت أحداً أعظم سلطاناً على نفسه منه) .

١١٨ - سعيد بن صخر الدارمي ئەڵێ: بە پیاوێک وترا وەصفی الأحنف بن قیس مان بۆ بکە .

وتی : کەسم نەبینیوە هێندەی ئەو زۆرترین دەسەڵاتی هەبێت بەسەر نەفسی خۆیدا) .

١٢٠ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثني شيخ في المسجد الحرام يكنى أبا محمد،** **حدثني بشير الجزري،** عن أبي الحجاج المهدي قال : من جعل شهوته تحت قدميه فرق الشيطان من ظله) .

١٢٠ - أبي الحجاج المهدي ئەڵێ : (هەرکەس شەهوەتی بخاتە ژێر پێیەکانی ئەوا شەیطان لە سێبەرەکەشی ئەترسێت) .

١٢٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا عبد الرحمن بن و اقد حدثنا ضمرة بن ربيعة، عن بشيربن طلحة، عن خالد بن دريك قال** : (لما ابتلي أيوب قال لنفسه : قد نعمت سبعين سنة فاصبري على البلاء سبعين سنة) .

١٢٦ - خالد بن دريك ئەڵێ : (کاتێک أيوب عليه السلام تاقيكرايەوە بە نەفسی خۆی وت : حەفتا ساڵ لە نیعمەتدا بوویت، جا لەسەر بەڵا ش حەفتا ساڵ ئارام بگرە) .

١٤١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني سلمة بن شبيب، عن جعفربن هارون عن الفضل ابن يونس قال** : قال رجل لعمر بن عبد العزيز: (يا أمير المؤمنين كيف أصبحت؟

قال : أصبحت بطياً بطيناً متلوثاً من الخطايا، أتمنى على الله الأماني).

١٤١ - پیاوێک بە عمر بن عبدالعزيز ی وت : ئەی ئەمیری ئیمانداران چۆن ڕۆژت کردووە؟

وتی : ڕۆژم کردووە بە تێری و سکپڕی وە بە بەرگی تاوانەوە، هیوام وایە الله بمپارێزێت) .

١٤٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني أبو عبد الرحمن الأزدي، حدثنا محمد بن عبد الله أخبرنا علي بن الحسن بن شقيق عن عبد الله بن المبارك : (أن الحسن قدم مكة فلم يضع جنبه ولم يطف فلما أصبح قيل له .

قال: وجدت في نفسي فترة فكرهت أن أعودها الضجعة.

١٤٣ - له عبدالله بن المبارك ەوە كە : (الحسن ڕۆشتە مەككە پاڵنەكەوت و بەرز نەبووەوە، كاتێک ڕۆژ بووەوە ئەوەی پێ وترا .

وتی : له نەفسمدا شتێک لە تەمەڵیم بەدی كرد ڕقم لێی بوو ئەو تەمەڵیەم بۆ بگەڕێتەوە) .

١٤٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني هارون عن سيار، حدثنا جعفر، حدثنا مالك بن دينار، حدثني شيخ أدرك الصدر الأول : أن نبي الله ﷺ كان يعظ أصحابه فيقول : (أرأيتم نفساً إن نعمها صاحبها وقنفها وكاربها ذمته غداً قدام الله، وإن خالفها وأنصبها وأتعبها مدحته غداً قدام الله، تيكم أنفسكم بين جنبكم) .

١٤٦ - مالك بن دينار ئەڵێ : شێخێک بۆی گێڕامەوە كە گەشتبوو بە سەدەی یەكەم كە پێغەمبەری الله ﷺ ئامۆژگاری هاوەڵەكانی ئەكرد ئەیفەرموو : (ئایا زانیوتانە نەفس خاوەنەكەی نیعمەتی پێ بدات و

گەورەی بكات و نزیكی بكاتەوە سبەی زەمی ئەكات لەبەردەمی الله، وە ئەگەر پێچەوانەی بكات و دوژمنایەتی بكات و عەیبداری بكات سبەی وەسفی باشی ئەكات لەبەردەم الله، ئاگاداری نەفستان بن كە لە نێوان لایەكانتاندایە) .

**١٤٨** - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثني محمد بن عمر المقدمي، حدثنا نهشل بن قيس العنبري، سمعت صخر بن أبي صخر قال: قال عامر بن عبد الله : أنا من أهل الجنة أو أنا من أهل الجنة؟ أو مثلي يدخل الجنة؟

**١٤٨** - صخر بن أبي صخر ئەڵێ : عامر بن عبدالله وتی : (من لە ئەهلی بەهەشتم؟! یان كەسی وەكو من ئەچێتە بەهەشت؟!) .

---

: ئایا كەسانی وەک ئێمە كە خاوەنی تاوان گەلێكی زۆرو قێزەونین شایەنی ئەوەین بەو پیسیەی خۆمانەوە بچینە شوێنێكی پاكی وەک بەهەشت كە بۆ گوێڕایەڵیكاران و صالحین ئامادەكراوە؟!

